# په پوی ژیان

خوشه گه ر رازی ژیان بزانین
شه می ژین تاره به هوی نه زانین

به قلم: محمد رشید قرنی زاده



# پەپووی ژیان

نووسراوە و وەرگێڕاوی

ماموّستا مەلا رەشید قەرەنی زادە

نام کتاب : په پوی زیان (۲۸ صفحه) ۱۳۷۹
نویسنده : محمدرشید قرلی زاده
شامل : ۱ - شعرکردی قرن۱٤ - ۲ - شعرفاسی قرن ۱٤
۳ - شعرکردی قرن۱٤ ترجمه شده ازعربی - ٤ - شعر
عربی قرن ۱٤ مصر ترجمه شده به کردی
شعر کردی قرن ۱٤
ناشر : قرنی زاده
شماره شابک : ISBN 964 - 360 - 041 - 6

## نشر

نام کتاب : په پوی ژیان
نویسنده : استاد محمد رشید قرنی زاده
لیتوگرافی : فرهنگ
چاپ : فرهنگ مهاباد - چهارراه آزادی - ۲۷۵۵۷
صحافی : فرهنگ
تیراژ : ۳۰۰۰ جلد
چاپ اول : ۱۳۷۹
ناشر : مؤلف
حروفچینی و صفحه آرائی : چاپ فرهنگ - با همکاری ماد کامپیوتر

شابک : ۹۶۴-۳۶۰-۰۴۱-۶

کلیه حقوق این اثر منحصراً متعلق به ناشر میباشد



# په پوی ژیان

سرووده‌یه‌که له وڵامی پرسیاره‌کانی زانا و پسپۆری مه‌زن «ئیبنی سینا» که له قه‌سیده‌ی «عینیه»دا له باره‌ی روح کردوویه کوتومه

روح چــیه داخــی گــران روون نــیه بــۆم
هه‌ر چی زانایه گێژه سه‌ری هه‌ر وه‌کوو خۆم
مـــن ده‌ڵێم ره‌مـــزی ژیـــانه ئـــه‌مما
وه‌سفی گوڵ کوانێ به ره‌نگ ده‌کرێ له‌بـۆم

ره‌شید قه‌ره‌نی‌زاده

## به ناوی خوای مەزن و زانا

زانای بەرزەفڕ «ئەبوو عەلی سینا» کە یەکێکە لە گەورەترین زاناکانی دنیای کۆنی ئیسلام، لە قەسیدەی «عینیە»دا کە داگرندەی بیست و یەك شێعری بەلیغی عەرەبی‌یە، گرانترین پرسیاری حیکمەتی و فەلسەفی (پەیوندی لەش و گیان) وەک ئەزموونێکی فیکری دەخاتە بەرچاوی پسپۆڕەکان و دەپرسێ: «رازی هاتنە خواری گیان بۆ لای ئەندام چیە و چۆنە...» و دوای لێکدانەوەیەکی هێژایانە کە بە شێوەی پرسیار و وڵام (دیالۆگ) داڕشتووە لە دواترین شێعریدا دەڵێ:

انعم برد جواب ما انا فاحص عنه فنارالعلم ذات تشعشع

بەخشش کە بدە وڵامی رازم بە تیشکی زانست لە تۆ دەخوازم

ئەوەندەی من ئاگام لێیە تا ئێستا دوو کەس لە زاناکان، یەکیان «حەکیم ئیلاهی» مامۆستای زانستگای تاران بە گوێرەی جێژنی هەزارەمین ساڵی وەفاتی «ئیبنی سینا» و ئەوی تر ئاغای «سیّد محمود ابولفیض المنوفی» یەکێک لە فەیلەسوفەکانی میسری لە کتێبی «تهافة الفلسفة»دا وڵامی «ئیبنی سینا»یان داوەتەوە، بەڵام بە زەوق و سەلیقە و بەرداشتی من وڵامەکانیان کافی و وافی بە مەبەستەکانی «ئیبنی سینا» نین. جا هەر بۆیە منیش ویستم بە زەوق و فامی کوردانەی خۆم وڵامێکی «ئیبنی سینا» بدەمەوە و داوەریش دە بەینی وڵامەکاندا دەدەمە دەست خوێندەوارەکانی ئەهلی فەن.

ئارمانجێکی ترم لەو قەستە ئەوە بوو کە چۆن بە هۆی قەدەغە و قۆرغی دوشمنان - داگیرکەرانی کوردستان - لە لایەک و کەمتەرخەمی

زانا و نووسەرانی کورد لە رابوردوودا دەرحەق بە زەمانی خۆیان لە لایەیکی تر ئەدەبیاتی کوردی نەگەشاوەتەوە بە تایبەت لە لقی حیکمەت و عیرفاندا... ویستم بە تەرجەمەی ئەو بەندە (قەسیدە)یە بە زمانی کوردی لە واژە پەتی‌یەکانی کوردی ئیستیلاح گوزاری حیکمەتی لەبیر چۆوەی زمانی کوردی بکەم. تا لە و رێیەوە هە رچەند کەمیش بێ خزمەتێکم بە ئەدەب و فەرهەنگی نەتەوایەتی کورد کردبێ.

ئەمما ئەو قسەیە (فەرهەنگ و ئەدەبی کورد نەگەشاوەتەوە) قەت‌قەت مەعنای ئەوە نیە کە گەلی کورد خاوەنی زانا و فەیلەسوف و عاریف و حەکیم و نووسەر و... نین. باوەڕ بکەن ئەگەر ئێمە لاپەڕەکانی مێژوو هەڵدەینەوە، دەردەکەوێ کە گەلی کورد بەو حاڵەش کە باسمان کرد، زۆر زیاتر لە گەلانی تری ئوممەتی ئیسلام زانا و نووسەر و حەکیم و مێژوونووس و موفەسسیر و عاریفیان داوە بە جامیعەی ئیسلامی. بەڵام بەداخەوە چون هەر بە زمانی بێگانە (عەرەبی، فارسی و تورکی)یان نووسیوە، خەڵک و خوێندەوارەکان، وەک نووسەر و عاریف و حەکیمی کورد، نەیانناسیون. نووسەری کتێبی «معجم‌البلدان» لە بارەی شاری «شارەزور»دا دەڵێ: «ئەو شارە بە ئەندازە ی هەموو دنیای ئیسلامی قازی و داوەر داوە بە جامیعەی ئیسلامی».

بە هە ر حاڵ ئەو حاڵەتە درێژەی هەبووە تا لە دوای هەزارەی هیجری زانا و شاعیری بەرز و بەرێز «ئەحمەدی خانی» لە سایەی ئەمارەتی نەتەوایەتی بنەماڵەی مەزنی «میر شەرەف خانی بدلیسی» کە هەموویان هەر دادگەر و ئەدەب پەروەر و هونەرمەند بوون بە تایبەت «میر عبدالخان» کوڕی «میر شەرەف» هەر وەک «ئەولیای چەلەبی» نووسەر و دیرۆکنووسی بابی عالی عثمانی نووسیویەتی بەڕاستی لە

هەموو فنوونی زەماندا ئەعجوبەی رۆژگار دەهاتە هەژمار توانی شاکاری «مەم و زین» بخولقێنێ و لە دوای ویش «مەلای جزیری» بە تایبەت لە مێرگی عیرفاندا و عیشق و سەفادا کەم کەس توانیوە تۆزی بشکێنێ و سەرئەنجام «نالی» زمان تەڕ و پاراو کە بۆ ماوەیەکی کەم لە حوکومەتی «بابان»ەکاندا تامی ئازادی چێشتبوو، توانی بە یارمەتی ئەوین بە «حەبیبە» خاتونی دڵداری، رەوانترین دیوانی پڕ لە نوکاتی ئەدەبی و شاعیرانەی کورد، ئیبداع بکا و لە دوای «نالی»ش دەیان شاعیری تری کورد؛ یەکێک لەوان سەرقافڵەی شەیدایانی حەقیقەت و عیرفان «مەولەوی سەید عەبدوڕڕەحیم»ی هەورامی بەتایبەت لە زانستی خوداناسیدا «کەلام» گۆی بەلاغەتی لە مەیدانی فەساحەتا لە هەموو کەس رفاند و سەرئەنجام مامۆستا «هەژار»ی سامانداڕ کە بە درێژایی تەمەنی لە کۆماری کوردستان لە مەهاباد و لە سایەی شۆڕشی بەردەوام و ئازادیبەخشی نەتەوایەتی بارزانی، لە کوردستانی عێراقدا زیاد لە دیوانە حێماسییەکەی بە وەرگەڕاندنی «شەرەف نامە»ی «شەرەف خان» و کردنە موکریانی «مەم و زین»ی «خانی» و لێکدانەوەی دیوانی «مەلای جەزیری» و خەییامە کوردییەکەی، فەرهەنگ و وێژەوانی کوردیان گەیاندۆتە دوندی رەوانی.[1]

جا ئێستا گەلی کورد لە سایەی قەڵەمی ئەو زانایانە و شاعیری گەورەی وەک «هێمن» و «حاجی قادری کۆیی» و... دەتوانێ سەربەرزانە بێتە مەیدانی شانازی و ئیفتیخار بە زمان و فەرهەنگی کوردی.

جا ئێستا من بۆ دەرخستنی ئەو داوایە، کە فەرهەنگ و زمانی

---

١ - ناوی ئەو چەند زانا و شاعیر و نووسەرانەم وەک نموونە یاد کردووە دەنا لە سایەی بەزەیی یەزدانی مەزن سەدان شاعیر و نووسەری ترمان هەیە.

کوردی لە حاند حیکمەت و عیرفانیش، نە هەزارە ئەو بەندە بەرزەی «نالی» مەزن لە خوداناسی و حەقیقەت پەرەستی و نیشاندانی عەزەمەت و شەوکەتی خوداوەندیدا یاد دەکەین کە دەفەرموێ:

لە کن ئەو جەوهەرە فەردە، لە هەیولا نیە باس
لە حیکەم پەروەریە بوو عەلی سینا نیە باس
بەزمی رەندانە ئەوە مەلعەبەیی وەعز نیە
لە بەد و نیکی و قوللابیە دونیا نیە باس
ئەوە جێی رەمز و ئیشاراتی دەروونە لە گەرووی
تەنگی پڕ غەرغەرەی واعیزی غەرڕا نیە باس
سۆفیان هاتنە مەجلیس وەرەقی دیدە بشۆن
لە کن ئەو دیمییە وشکانە لە دەریا نیە باس
جێی زمان گرتن و دڵ رەوشەنی و سووتانە
موقتەدا شەمعە کە خامۆش نیە ،ئەمما نیە باس
حەزرەتی هەیبەتە نەک غەیبەت و رەیبەت «نالی»
ئەڵڵاە ئەڵڵاە چە حزوریکە کە ئەسڵەن نیە باس

کە لە ڕاستی من پێموایە کەس نەیتوانیوە لە بارەی جەلال و شکۆ و حزوری بێ کەمم و کەیفی پەروەردگاری زانا و توانا، لەو غەزەلە بەرزتر شتێک بێژێ و یا لەو تەسویرەی «نالی» واقیع بینانەتر بتوانێ لە بارەی وجودی موتڵەقی خوداوەندگاری، وتاریک دەربڕێ. هەزار ئافەرین بۆ «نالی».

خوێنەرانی بەڕێز هەروەک لە پێشەوە ئاماژەمان کرد ئاغایانی «حکیم الهی» و «ابو لفیض المنوفی» وڵامی ئیبنی سینایان داوەتەوە، ئیلاهی

دوای تاریف له قەسیدەی «عینیه» بەو چەند شیعرانەی خوارەوە کە دەبێژێ:

عینیه کە نام این قصیده است — از رشتهٔ محکمی تنیده است
هست از رشحات بحر دانش — چون ژاله به برگ گل چکیده است
بر عین اگرش کنی اضافه — یک نقطه به الف سر کشیده است
با جشن هزاره شد مطابق — که اندر همه عمر کس ندیده است
کم کن تو حکیم زین نیایش — سیناست که از او سنا رسیده است

له بارەی تاریخی له دایک بوونی ئەبوو عەلی‌دا دەڵێ:

تاریخ ورود ابن سینا — در کاخ جهان ز قصر مینا
از زایچهٔ کتاب هستی — شد طلعهٔ نور نزد بینا

«۳۷۰»

و بۆ دیرۆکی وەفاتی بووعەلی دەفەرموێ:

بوعلی چون نمود عزم صعود — از سرای فنا به دار خلود
شد ز تاریخ نامهٔ رحلت — حی عبد بسعی الی المعبود

«۴۲۸»

«حکیم الهی»

ئەوجار دەست دەکا بە تەرجەمەکە بە نەزم و نەسری فارسی بۆ نموونە ئاوا دەست پێدەکا:

هبطت الیک من المحل الارفع — ورقاء ذات تعزز و تمنع

فرود آمد به سوی تو از جایگاهی بلندتر کبوتری خداوند چیرگی و بزرگی

«چم»

فرود آمد از جایگاهی بلند — ترا یک کبوتر بسی ارجمند
بود آن کبوتر ترا آن روان — که باشد به زیر و به بالا روان

«چامه»

و هاکه زا تا ئاخر .ئه و جار ولامی ئیبنی سینا ده داته وه، که مــن له دوای ته رجه مه کوردیکه ی خوم ده گه ل ولامی ئاغــای (منوفــی) ده یان نوسمه وه.

خوینده واره بریزه کان ، له هه ر زمــانیکدا هیندیــک مــه ســه ل و رسته ی کورت و ره وان و جــوان و پرمانــا هــه ن ، کــه مــه گه ر بــه موعادیل ده نا ته رجه مه ی ده قا و ده قیان نا مومکینه یان نابه لیــغ دیته ده ر . مه سه له ن وه ک رسته‌ی ( ضربه لازب) له شیعره کــانی ئیبنی سینادا ، که به هیچ وه جهیک ته رجه مه ی کــورت و ره وانــی پیک نایه. جا هه ربویه ئه و ته رجه مه ی من ته رجه مه یه کی ئازاده . به لام موحته وای مه تن له به رچاوگیراوه.

ئه و نوکته یه ش ئه شی بلیم، که به قه ســتی هاســان بــه راوه ر کردنی ، کوردیکه و ئه سله که شیعره عه ره بیه کان له ســه ره وه و کوردیه که ش ، له خواره وه ی داده نیم.

ئیســتا هیــوادارم خــودای پــه روه ر دگار و زانــا توانــاییم پــی به خشی تا له عوده ی ئه و کاره گرینگه به چاکی بیمه ده ر.

رمزبه ری ۱۳۷۵ هه تاوی
محمد رشید قرنی زاده

# قەسیدەی (عینیە) و تەرجەمەکەی بە کوردی

هبطت الیک من المحل الارفع
هاتە خوار بولات لەجیی زور بلند

ورقاءذات تعزز و تمنع
کوتریکی خاودن نازو ئەرجو مەند

محجوبة عن مقلە کل عارف
پەنهان لە چاوی هەمو زاناکان

و هی التی سفرت و لم تتبرقع
«رو تە ک»[1] کوچی کرد بە رەو لای مەکان

وصلت علی کره الیک و ربما
ناشاد هاتە لات ، سەیرە لە دوادا

کرهت فراقک وهی ذات تفجع
شیوەن لە دوریت. کریان سەردە دا

انفت و ما انست فلما واصلت
بلند پەرواز بو لە دیتنی داو
لە هاو سایە گی ویرانەی نەندام

الفت مجاورة الخراب البلقع
کەچی بەو حالە ش زورچاکە و تەرا و
دلی گە شاوە و بە ستە ی زولفی خام

(۱) روتە ک - بە مجرد

و اظنـها نــيت عــهوداً بـــالحمی
واده کـه م گومـان پـه یمانـه کـانی
له بیر چو تـــه وه ، واده رده کـه وی

و منـــازلاً بفراقـــها لـــم تقنــــع
هـه وارگه ی یـاران نـاو نیشــتمانی
گه‌رچی له دوریان ده بو نه سره وی

حتـی التصلـــت بـــهاء هبوطـــها[1]
تاگرتی په یوه ند به(ژیی) ژیرکـه وه

عـن میـم مرکزهـــا بـذات الاجـــرع
له نونی ناوه نـد دنیـای ژورکـه وه

علقـت بثـــاء الثقیـــل فـــاصبحت
چه سپابه سینی سه نگین جیسمانی

بیـــن المعـــالم والطلـــول الخضــع
هاته گرفتــار تـه پکـوک کویسـتانی

تبکـی و قـد ذکـرت عـهوداً بـــالحمی
گریـا لـــه یـادی کـاتی نیشـــتمان

بمدامــــع تـــهمی ولــــم تتقطـــع
رژاندی ئه سرین به تاو بـی و چـان

و تظـل سـاجعة علـــی الدمـــن التـــی
ده ستی کرد به شین به بــه نـد و بـاوان

درســت بتکــرار الریـــاح الاربـــع
ویرانه هه وار بـه چواربـای زه مـان

اذعاقـــها الشـــرک الکثیـــف فصدهـــا
چون داوه ل ماکه ، به ست بوی لـه زه میـن

نقـــص عـــن الاوج الفـــبح المربـــع
بال به سته چلون بو سه ر هه لفریـن

(۱) پیته کانی (ها) و (م) و (ثاء) که که سو که له ی واژه کانی : (هبوط) و (مرکـز) و (ثقیل) ن ، له فه رهه نگی عه ره بیـدا کراونـه، ره مـزی ئیسـتیلاحی حیکمـه تـی و فه لسه فـی . منیـش لـه تـه ر جـه مـه کـه دا پیتـه کـانی : (ن) و (ژ) و (س) م کـه سوکه له ی واژه کانی : (ناوه نـد) و (ژیـرک) و (سـه نگیـن) ن . کردمنـه ره مـزی زاراوه ی حیکمه تی و فه لسه فی ئه ده بیاتی کوردی . (ژ) له جاند (های) هبـــوط و (ن) له جاند (میم) مرکـز و (س) لـه جـاند (ثـای) ثقیـل .زیـاد لـه وه ش دو واژه ی (ژیرک) و (ژورک) ده توانن له جیی دو واژه ی (اوج و حضیض) دابنیشن

حتى اذا قرب المسير الى الحمى
تا نیزیک بو- وه رویین بو هه وار

و دنى الرحيل الى الفضاء الاوسع
کوچ بو حه وای پاک سه رچه‌رخی ده وواد

هجعت و قد كشف الغطاء فابصرت
خه وی لیکه وت و په رده لادران
(به چاوی نوستوی خه والوی لالو

مالیس يدرك بالعيون الهجع
دیتی نه وان شت نه ده بینـدران
که شفی حه قیقه ت کرانه خالو)

و غدت مفارقة لكل مخلف
(روته ک)هاته ده‌ر له ماف جیسمانی

عنها حليف الترب غير مشيع
ئه وانه ی خاکین دژ به ئاسمانی

و بدت تغرد فوق ذروه شاهق
ده ستی کردده ی‌خویند له‌دوندی بلند

والعلم يرفع كل من لم يرفع
زانست ده کا به رز. حه تتا پیاوی شه ند[1]

فلأى شيئ اهبطت من شامخ
په س نه رای چی بو نه و یان خسته خوار؟

عال الى قعر الحضيض الاوضع
له به رزی ره وه ز بو نزمی نزار

ان كان اهبطها الاله لحكمه
گه ر بویه خودا هه لیداشته خوار

طويت على الفطن اللبيب الاورع
رازیکه په نهان له زانای هوشیار

فهبوطها ان كانه ضربة لازب
گه ر هاتنه خواری هه رده بو ببی

لتكون سامعه بما لم يسمع
تانه بیستوکان . که ره ک بشنه وی

و تعود عالمه بكل خفيه فى
تابیت به زانای رازه ورده کان

العالمين فخرقها لم يرقع
بوی رون نه بو- وه.رازی مه رگ و ژیان

---

(۱) شه نده - به پیاوی پوخه له کورد ده بیژی : شه نده له مه نده که متر نیه

وهي التي قطع الزمان طريقها
باشوی زه مانه ریگای لیبری

حتى لقد غربت بغير المطلع
به پوی ژیان ناچار.له لان ده‌ر په ری!

فكأنما برقٌ تألق بالحمى
هه ر وه ک بروسکیک، تورسکایه وه
نه ستیره ی به ختی وه ها ئاوابو

ثم انطوى فكأنّه لم يلمع
له ناو هه وار گه ل زوکوژایه وه
ده ت کوت هه لنه بود، له که ل ئاوابو

انعم بردّ جواب ما انا فاحصٌ
به خششکه بده ولامی رازم

عنه فنارالعلم ذات تشعشع
به تیشکی زانست له تو ده خوازم

## ته واو بو



حافظیش هه ر له و باره دا و له و به نده دا (حجاب چهره جان میشود غبار تنم) ده لی:

په رده ی روخساری گیانه ئه و غوباری به نده نم
خوش ده بوکاتیک له سیمام ئه وحیجابه ی دارنم
قه ت قه فه س شایانی ئه منی خوش ئاوازه نیه
ده چمه وه گولزاری مینومامری ئه و چیمه نم
رون نه بو - وه بوچی هاتم چون ده روم!
داخ وحه سره تمه که وا غافل له کاری زیسته نم
چون بکه‌م په‌رواز له دنیای پان‌وپوری قودسیه‌ت
تا گرفتار ته خته به ندی داوه لی خانه ی ته نم
گه‌ر له خویناوه‌ی هه‌ناوم بونی‌خوشی عیشق دی
واق مه مینه هاونشینی نافه ی ولاتی خوته نم
ره نگی زیرینی کراسم مه روانه وه ک شه مع
سوزی نیهانی ده رونه ره نگی دای پیراهه نم
هه سته بستینه له «حافظ» حاله تی بونی له خوی
شه‌رته تاتو هه ی نه‌بیسی لیم که سی که من منم

پرسیارەکانی زانای زەمانە
لیرە تەواو بوون لەمەڕنیسانە
تا ئێستا هەروا سەربەمۆر ماون
ڕەمزی ئەو گەنجە، بە کەس نەشکاون
هەر بۆیەش ویستم وڵامی بدەم
لە دوای هەزار ساڵ رازەکەی فاش کەم
بەڵام لە پێشدا وڵام دوو زانا
چاکە یاد بکەم بۆ ئیبنی سینا
چونکە پێموایە گەرچی زۆر جوانن
ناکافی بە مراد پرسیارەکانن
یەکیان دانیشمەند «حەکیم ئیلاهی»
بە فارسی داویە، خۆی دانیشگاهی
دوەم «منوفی» میسری و فەیلەسوف
ئەدیبی عەرەب، بەدری بێ خسوف
ئەو جارە لە ژێر دروشم پەپووی ژیان
وڵامەکەم دێ بە کوردی و رەوان

## وڵامی ئاغای حەکیمی ئیلاهی لە زمان ئیبنی سیناوە

ایــــا پــرهنر مــرد والانشـــان بــه هــنگام گـفتار گـوهرفشان
خـردمند و بـادانش و هـوشمند درآرنـده هـر رمـنده بـه بـند
کـبوتر کـه گـفتی بـود آن روان که آن شد ز تن تن به آن شد روان
در آغــاز هــر دو بـه یکبارگی شـدندی در ایــن راه هـمبارگی
ولی تــن بـه ویـرانگی رو نـهد به دست روان هر چـه دارد دهـد
پس از رفـــتن آن ز دیـر کــهن سپردن مـر آن را بـه زاغ و زغـن
اگــر گـوهرش بـاشدی تـابناک نگشته گـرفتار ایـن تـیره خـاک
بـدیدار یـزدان شــود کـامیاب فـــتد کشــتی آرزویش بـــه آب
اگـر گـوهرش بـاشدی تـیره دل فتاده بـه مـرداب تـن پـا بـه گـل
ز دیــدار یــزدان شـود نـامید که تـا گـرددی پـاک و آیـد نـوید

### پایان پاسخ

## ئەوەش وڵامی ئاغای حەکیمی ئیلاهی بە نەزەری خۆی

ایــــا بـــرگشاده دو بـــال خـــرد که تا جامه خود بـه گـردون بـرد
بـــدانــد هـــمه رازهـــای نـــهان گشـــاید هـمه بستەهای جـهان
روان را بـــد آمـــادگی از نـخست که خود را نماید به گـیتی درست
شود پارەای زیـن هـمه پـارەها کــند هـــمدمی او بـــه آوارەهــــا
پس آنچه بود خواهش ایـن رمـه فروهشته در خواهش ایـن هـمه
بد و نیک هـر یک از ایـن خـاندان بود در گرو پـیش ایـن خـاکـدان
بسی خـوبها کـه در آن بـد بـود ولی بد یکی خـوب آن صـد بـود

نشاید از ایـن خـوبها درگـذشت | که بدها بود در چنین درگـذشت
گـذشته بـدیها هـمه نیستند | شـوه آیـد آنـجا کـه از چیستند
بود بـهترین پـاسخ آنکـه خـرد | بـه آئـین ز دشـوارهـا وارهـد

پایان پاسخ شهریور ۱۳۳۱

ئەوەش وڵامی ئاغای «منوفی» کـە لە قـەسیدەی «نشیدالارواح»دا وڵامی ئیبنی سینای داوەتەوە، کە هەشت شیعری لەو قەسیدەیە لە ژێر شەرحی حاڵی ئیبنی سینادا لە کتێبی «تهافة الفلسفه»دا یادی کردووە[1]

هـیا یـا سرب المعالی | نحـو ابـواب السما
سرنـا سر عـجیب | ضـل فـیه الازکـیاء
جسـمنا رمـز بـدیع | الهـته القـدماء
ذاتـنا کـنز ثمـین | اعـی فـهم الحـکما
قـد هـبطنامن عـلو | لامـتحان و ابـتلاء
و ظـهور لصـفات | حـیث نحـن الخـلفاء
و لقـد عـدنا الیکـم | نـرتجی کشـف الغـطاء

ئەوەش تەرجەمەی شیعرەکانی منوفی

هەستە ئەیَ پۆلی شەرەف، تا بەرەو ئاسمان فڕین
زۆر کـەمە مـەودای ژیـانت لە دەوری ڕۆژگـار

---

۱ - دارالکتب‌العربی، بیروت، چاپ یکم، ۱۳۸۷ هـ، ۱۹۶۷ م.

زاتـــی مـــه رەمـــزێکـه سـەرگەردانـه لێی
ئەزکیایی عیلم و حیکمەت فەیلەسوفی خۆشنیگار
جیسم و جانی ئادەمی ئەوەند عەجیبە خەڵکی کۆن
خـــوای نـــەناسی خـــۆی لێ بـــووە خـــاوەندگار
دافڕیـنی روح لە ژوورکـی ئـاسمان بـۆ لای زەوی
ئـــیقتیزای تـــەقدیرە، ئـــەمری بـــەرزی کـــردگار
مـــانەوەی گـیانیش لە نـاو مـیرگـی بـــەدەن
بـــوو بـه ئـەزموون ئـێمـه چـۆن دەرچـین لە کـار
مەزهەری ئەسمای حوسنای خوداوەند بـینـه دەر
پـــاک و زانــا بـین و نـوێنـەری پـەروەردگار
خـــۆت بـناسا و دڵ بـــه عـــیرفان روون کـــەوە
جـلکی مـاددی گـەر فڕێدەی لایـیقی ئـەفرەندگار
کـــاتی پـــەروازیش پـەرەو دنـیای سـەروو
لادەچـێ پـەردە لەبەر چـاو رازەکـانیش ئـاشکار
پوشپەڕی ١٣٧٥ هەتاوی

## پەپووی ژیان

وڵامی پرسیار کاک ئیبنی سینا
پەروازی پەپووی ژیان لە "سینا"
بۆ وادی توای خاکەکەی ئادەم
رازێکە گران بە سادە نادەم
کەشفی رەمزی راز گەرچی گرانە
زانا لەو گێژە خۆی سەرگەردانە
بەڵام بە حوکمی ئیقتیزای شعوور
تیشکی فامینم لە مەنبەعی نوور
واداری کردم تیری راوێژم
بۆ کۆتری پەری جاری باوێژم
بەڵکە یاوەر بێ لوتفی کردگار
پەردە لابدەین لەرووی گەشی یار
ئێستا پێموایە ئەگەر تێی فکرین
تەختێ موتاڵا و کەمێک کۆژەر بین
ئایەی: «اذ قال للملائكە
انی جاعل»[1] ئیشکال حەل دەکا

١ - واژەی «انی جاعل» بەشێکە لە ئایەی ٣٠ سوورەی «بقرە» کە خودای مەزن و زانا تا ئایەی ٣٨ داستانی خەلقی ئادەم «باوە گەورەمان» و شەڕە زێڕنگەرانەکەی دەگەڵ فریشتەکان؛ بۆ پێغەمبەری ئیسلام محمّد مصطفی (ص) نەقڵ دەکا کە رەنگە ئەو ئایەتانە وڵامی پرسیارەکانی ئیبنی سینا بدەنە دەست و گەرچی تا ئێستا موفەسسیرەکان نەیانتوانیوە تەفسیری تەکوینی ئەو ئایەتانە لێک بدەنەوە و مەسەلەی عیلمی غەیبی فریشتەکان. بە ئایەندەی

بەلام پێویستە تیشکی زانایی
بدەین لە دەماخ گەش کا بینایی
خۆشە گەر رازی نیهان بزانین
شەمی ژین تارە بە هۆی نەزانین
تەنەووع خواستی خەللاقییەتە[1]
سروشتەی سروش[2] لە لەش حیکمەتە
جیهانی پەری بەدایع بالا
بێ «کەمم» و «کەیف»ن بۆ کار نە کالا
جا تەقدیر فەرمای بە کۆتری پەری
لەسەر بەرەو ژێر بۆ خاک دافڕی
قەزاش بە حیکمەت پێیاندا فەرمان
ئاشنا بینە دەر گڵ و دڵ و گیان
خودا خودایە و زانای رازەکان
چ «کەم» بێ و چ «کەیف» زەمان و مەکان
پەردە نیە لە پێش بینایی و هێزی
ئیستا و ئایەندە و رابردوو و سۆزی
هەمووی لێدیارە راز و نیازی
هەر لە خۆی جوانە حیکمەتپەردازی

بەشەر تەوجیە بکەن کە چۆن فریشتەکان ئایەندەی ئێستا نەخولقاوی ئادەمیان خوێندەوە. بەلام ناوی ئەو شتانەی خودا بۆی ئامادە کردن نەیانزانی و...

١ - واژەی «خەللاقییەت» کە حیکایەت لە سیفەتی بەرزی کردگاری دەکا خوازەری تەنەووعی خیلقەتە یانی خەللاقییەتی زۆر شتە نەک شتێک زور.

٢ - مراد لە واژەی «سروش» فریشتەگی و روحانییەتە.

خاسیەت تەرکیبە ئەگەر بزانی
سنیەم دێتە دی نە ئەو نە سانی
ئەمما نیزیکە لە وان ئەتواری
تەقدیرە وای کرد بە کردگاری
لە ئەستێ و پووشو و سەنگی چەخماخە
بروسکە دەدا شادی دەماخە
ئەو کاتەش تیشکی پەپوولەی ژیان
دای لە قەوارە گورا گەرایان
پەیدا بوو شتێک پڕ لە ئەسرارە
عاجباتی خیلقەت گوڵی ڕۆژگارە
ئێستا ئەو شتە ناوی ئینسانە
نوێنەری بەرزی خودای ڕەحمانە



بۆ نارازی هات! ناشاد گەڕاوە؟
ئەدێ ڕاز چ بوو لەو دانە و داوە؟
ئەو کاتەی تەقدیر پەپووی نارده خوار
بۆ ناو قاپۆڕی قوڕینەی نەیار
واق ما لە جێگای تازە و کۆنەکەی
لە کۆشکی مینا بچتە ناو کۆگەی
ناچار سڵەی کرد لە دیتنی داو
بەڵام بە تیشکی ئەوین کەوتە ڕاو

چــــونکه تــارمایی پــەری حــەووایــی
دەینواند دوورادوور هـومای شـەیدایـی
ئـینسان لە «أُنســە» و ئـەنیس گـەرەکـە
شــادە لە دۆســتان دوژمــن تــەرەکــە
مــــیهرە هـــەوێنــی ئــەوینداره‌کــان
هــەودای پــەیوەندی شـــەیدا زارەکــان
مــــەجنون لە بــیابان بــە دوی لەیــلادا
ئـــــەوین رایکــێشــا بــەولا و ئــەولادا
هەر بـۆیـەش کـوتری بـەرزی ئـاسمانی
هــاتە گــرفتار بــە هــەودای جــوانــی
جــا یــاد نــیشتمان هــۆی پــەریشانی
دیـــدار تــازەدۆست مــایەی شــادمانی
کــاتێک فــەرمان هــات بــۆ جــودایـەتی
بــــپسێنـــــن هـــــەودا لە ئــاشنایەتی
نــاچار بــوو دیســان شـیوەن بگــێڕێ
حــــەیاتی ئــاشق ئـــەوین دەگــێڕێ



بڵێی لە پـەیوەند لەش و پـەیووی ژیـان
سوودێک پێکهاتبێ و زانست بۆ ئـینسان
مــــــیعیار داوەری فــــامە ئـــــاشکارە
نــاسینی ســروشت کــەشفی ئـەسرارە

ئــــەسراری حــیکمەت ئــەو کــائیناتە
زۆر و ورد و جــوان جــێگــای عــاجباتە
لەرزەی پــــەپوولەی گــوڵاڵەی چــیمەن
شەیدا شێت دەکەن مەجنون وەکوو مـن
قــەتارەی قــورینگ لە ئــاسمانی شـین
هــــازەهازی بــاڵ، قــازگەلی نــەخشین
رەورەوەی رووبــار لە جـۆگـەلەی ژێـن
هـاڕەی هـەڵدێران بـەرەو دەریـای شـین
قــاسپە قــاسپی کــەو لە چـیا و لە رازان
ســـازی ســروشتین دەر دەخــەن رازان
هــەوای عــەترامـیز کــە بـا دەیـهێنـێ
زولفـــــی هـــــاڵۆزی چـــەمەن دادێنـێ
قــەددی کــەشیدەی چــنار و عــەرعــەڕ
راستراست وەک باڵای کەژاڵ و ئـەسمەر
گــەر مــرۆڤ نــەبا کــێ تـێدەگـەیشت
ئـــافەرین بکــا لە خــاوەن ســروشت
ئــەوسافی ئــاسار حــەیات لە مـنەوە
کــوا تــەواو دەبــێ تـێهـەڵدەچـمەوە
دیــمەنی بــەرز و شکــۆی کـۆســاران
گـــرمەگـــرمی هــەور کــاتی ئـێواران

بەرق و بریسکە و ریژنەی بارانە
بە گوللەی تەرزە بەردە بارانە
دەریای پان و پۆڕ نەهرەتەی شەپۆل
نەڕرە نەڕری شێر لە جەنگەڵ و چۆل
لە تاو هەڵمەتی هەڵۆی بەرزەفڕ
دەلەرزن مامز مامریش لە قڕ
کوڕانی ئازا و جوانچاک و دڵ پاک
گیان باز لە ریگای نیشتمان و خاک
نەبەردی نەبەز تانک شکێنی کورد
شەهێنی چیای قەندیل و هەڵگورد
گەر مرۆڤ نەبا کێ تێدەگەیشت
ئا فەرین بکا لە خاوەن سروشت
زمانم لەنگە و بیرم چەمیاوە
لە تەونی ژیان دەنا زۆر ماوە
هۆی خەڵقی مرۆڤ رەمزێکە دیارە
ئادەم جێنشین لە کردگارە
تەعمیری زەوی و کەسبی کەماڵات
بە هاوکاری لەش چاکتر پێکدەهات
تەقدیر بە حیکمەت بۆیە دای فەرمان
پەیوەند سەر بگری دەگەڵ لەش و گیان

ئەو هەمووە فەن و نەخش و کرکارە
ئاسەواری فام بیری رۆژگارە
فرەی فرۆکە و پەرۆکەی[1] حەوا
وەک شەهابی نوور دەخشن لە هەوا
ئێستا «ئەتۆم» و «لایەتەجەززا»ش
وردورد ئەنجنان ئەسرار دەکەن فاش
نۆترۆن، پرۆتۆن کەوتنە کایەوە
ئەلەکتر بە شەو درەوشایەوە
ئەشیعەی ئیکس و لەیزێر دەکاردان
سەیرە ئەوانیش بوونەتە دەرمان
خۆزگە زیندوو بای ئیبنی سینای پاک
زانست ئینسانی گەیاندە ئەفلاک
مرۆڤ چۆوە سەر مانگ توخوداهەستەوە
سەفینە بردی وەکوو رەورەوە
لە چەندین هەزار میتر بەرزایی
دەسووڕێن، بوونە پەری هەوایی
ئەوانە هەمووی گەر مرۆڤ نەبا
دنیا بێفایدە دەبوو نەبووبا
شاکاری خیلقەت بۆیە بە یەقین
لە خەلقی مرۆڤ دەکا ئافەرین

---

۱ - پەرۆکە: مووشەک

لە نــــاو مـــەنگوڕان قـــاوە دەبـــیژن
نـــە بـــادانـــەوە عـــەیبە نـــە جـــیژن
ئـــە و جـــارەش نـــاچار تـێهـەڵدەچمەوە
لە بـــاغی زانست بـــێ گـــوڵ نـــاچمەوە
ئـــەدەب پـــەروەری خـــاسەی ئـــینسانە
ئـــاکـــامیش دیـــارە عـــیلم و عـــیرفانە
ئـــاگـــاهی لە نـــەزم، ئـــەسراری هـــەستی
فـــــامای رازەکـــــەی خـــودا پـــەرەستی
ســــــوپاسی نـــیعمەت لە ئـــاخری کـــار
فـــەڕزە لە ســـەرمان بـــۆ پـــەروەردگار
ئەو کاتەش ئـیمـە خـۆشبـەخت دەژیـن
کە وەک پیاوی بـەرز بـە ئـەخلاق بـژین
بـا بـەسکەین ئـیتر گـەرچـی پـەرۆشـم
لەو بـاسە چـاکـە چـیتر نـەکۆشـم

ڕەزبەری ١٣٧٥ هەتاوی
ڕەشید قەرەنیزادە



گه رچی من ده مرم ده میق زینده زینده نه خشه که م
شاد ده بی روژیك هیوامه ئه و به ئازادی گه لم

به زوبی هه ر له و نوسه ره ۱۰۰ به یت له دیوانی حافظ
به نه زمی گـــوردی به نـــاوی (په یامی حـــافظ)
و هـــه روه ها کتیبی (تــه جــویــدی قــورئان)
به مه تنی فارسی و ته رجه مه ی کوردی په خشان ده کری

نرخی ۳۵۰ تمه نه